أَعۡلَمُ بِمَا يُنَزِّلُ قَالُوٓاْ إِنَّمَآ أَنتَ مُفۡتَرِۭۚ بَلۡ أَكۡثَرُهُمۡ لَا يَعۡلَمُونَ ﴾، دەڵێ: **(كانَ إذَا نَزَلَت آيَة فِيهَا شِدَّةٌ، ثُمَّ نَزَلَت ءَايَة أَلْيَنَ مِنهَا تَقُولُ كُفَّارُ قُرَيش: واللّهِ مَا مُحَمَّدٌ إلاّ يَسْخَرُ بأصْحَابِهِ، اليَومَ يأمُرُ بأمرٍ، وَغَداً يَنهَى عَنهُ، وَإنَّهُ لا يَقُولُ هَذِهِ الأشياء، إلاّ مِنْ عِنْدِ نَفسِهِ، فَأَنزَلَ اللّهُ:** ﴿ وَإِذَا بَدَّلۡنَآ ءَايَةً مَّكَانَ ءَايَةٍ ﴾).

واتە: کاتێك ئایەتێك دادەبەزی توندییەکی تێدا دەبوو، دوایی ئایەتێکی لەو نەرمتر دادەبەزی، کافرەکانی قورەیش دەیانگوت: بە خوا موحەممەد هەر گاڵتە بە هاوەڵانی دەکات، ئەمڕۆ شتێکیان فەرمان پێدەکات، بەیانیش ئەو شتەی کە دوێنێ فەرمانی پێکردوە، قەدەغەی دەکات، ئەو شتانەی کە دەیانڵێ: بەس لە لای خۆیەوە دەیانڵێ! - بەو بۆنەیەوە - خواش ﷻ ئەم ئایەتەی ناردە خوار: ﴿ وَإِذَا بَدَّلۡنَآ ءَايَةً مَّكَانَ ءَايَةٍ وَٱللَّهُ أَعۡلَمُ بِمَا يُنَزِّلُ قَالُوٓاْ إِنَّمَآ أَنتَ مُفۡتَرِۭۚ بَلۡ أَكۡثَرُهُمۡ لَا يَعۡلَمُونَ ﴾.

واتە: زۆربەیان نازانن و، لە قسە تێناگەن کەمێکیان تێدەگەن و، بڕواشیان بەو قسەیە نیە، بەڵام بۆ چەواشە کردن و کڵاو لەسەر نانی خەڵکە چەواشەکراوەکە، ئەو قسانە دەکەن.

## کورتە باسێک: پێنج سەرنج بۆ ڕوونکردنەوەی ئەوە کە: ئایەتی (١٠١) مەبەست پێی نەسخ نیە

١/ ناگونجێ ئەم ئایەتە باسی نەسخ بێ، هەرچەندە زۆربەی یاخود سەرجەم تەفسیرەکان، وایان داناوە! بەداخەوە، چونکە نەسخ گەر هەشبێ لە یاساکان (الأحكام) دایە و، لە قورئانی مەککەیشدا حوکمە شەرعییە دیاریکراوەکان کەمن و، ئەو حوکمە شەرعییانەش کە لە قورئانی مەککەیی دا هاتوون، نەسخیان بەسەردا نەهاتوە، یانی: ناتوانین نموونەیەك بێنینەوە لە ئایەتە مەککەییەکان، کە نەسخ کراوەتەوە، یان حوکمێك، چونکە لە قورئانی مەککەیی دا، ئەو حوکمە شەرعییانەی کە دەهاتن، چ پەیوەندییان بە بووناسیی یەوە بووبێ، چ بە ئیمان و عەقیدەوە، چ بە عیبادەتەکانەوە، چ بە ڕەوشتەکانەوە، چ بە حەڵاڵ و حەڕامەوە، حوکمی گشتی بوون، نەك سنووردار و دیارییکراو، وەك لە قۆناغی مەدینەدا ئەو جۆرە حوکمانە هاتوونە خوار، بۆیەش ئەو حوکمە گشتییانە، پەیوەندییان بە هەر لایەکەوە بوو بێ، نەگونجاوە نەسخ و لابرانیان بێتە سەرێ.

٢/ بێگومان مەبەست لە (آية)، هەر ئایەتی خوێنراوەیە: (الآية المَقرُوءةُ)، نەك موعجیزە، چونکە هەندێك لە زانایان بۆ ئەوەی خۆیان لەوە دووربخەنەوە کە نەسخ لە قورئاندا نیە و، هیچ ئایەتێك لە قورئاندا نەسخ نەبۆتەوە، گوتوویانە: لێرەدا مەبەست لە ئایەت: موعجیزەو بەڵگەیە، بەڵام بۆیە ڕێی ئەوەمان نیە، چونکە خوا دەفەرموێ: ﴿ وَإِذَا بَدَّلْنَآ ءَايَةً مَّكَانَ ءَايَةٍ وَٱللَّهُ أَعْلَمُ بِمَا يُنَزِّلُ ﴾ ئنجا مادام باسی دابەزاندن: (يُنزِّل)، کراوە، کەواتە: مەبەست پێی ئایەتی خوێنراوەیە، نەك ئایەتی موعجیزەو بەڵگە و، بە زۆر لەخۆکردن (تَكَلُّف)، دەگونجێ بڵێی: مەبەست موعجیزەیە، چونکە موعجیزەش هەر بە فەرمانی خوا دێ و، فەرمانەکەی خوای پەروەردگاریش لەسەرەوە دێت و دادەبەزێ!

٣/ ئەو ڕایەی زانایانیش کە گوایە ڕستەی: ﴿ وَلَا تَجْهَرْ بِصَلَاتِكَ وَلَا تُخَافِتْ بِهَا وَٱبْتَغِ بَيْنَ ذَٰلِكَ سَبِيلًا ﴿١١٠﴾ ﴾الإسراء، گوایە بە ڕستەی: ﴿ فَٱصْدَعْ بِمَا تُؤْمَرُ وَأَعْرِضْ عَنِ ٱلْمُشْرِكِينَ ﴿٩٤﴾ ﴾الحجر، نەسخ بۆتەوە، وەك (محمد الطاهر بن عاشور) بەهەق گوتوویەتی: ڕاست نیە، چونکە ئەو ڕێنماییانە هەموویان پەیوەستن بە قۆناغە جیاجیاکانی بانگەوازوە و، هیچیان نەسخ نەکراونەوە!

واتە: (**محمد الطاهر بن عاشور**) دەڵێ: ئەوەی کە لە کۆتایی سوورەتی: (**الإسراء**)دا، خوا دەفەرموێ: نوێژەکەت یاخود پاڕانەوەکەت بە دەنگی بەرز مەڵێ و، زۆر بە دەنگی نزمیش مەیلێ و، لەو نێوانەدا: ڕێیەك بدۆزەوە، واتە: با نە زۆر بەرز بێ، نە زۆر نزم بێ، گوایە بە ڕستەی: ﴿ فَٱصْدَعْ بِمَا تُؤْمَرُ وَأَعْرِضْ عَنِ ٱلْمُشْرِكِينَ ﴿٩٤﴾ ﴾الحجر، یانی: بە دەنگی بەرز، ئەوەی فەرمانت پێکراوە، ڕایبگەیەنە و، پشت لە هاوبەش بۆ خوا دانەران بکە، گوایە ئەوەی (**الإسراء**) بەوەی (**الحجر**) نەسخ بۆتەوە!! ، (**محمد الطاهر بن عاشور**) قسەکەی جوانە، کە دەڵێ: ئەو ڕێنماییانە هەموویان پەیوەستن بە قۆناغە جیاجیاکانی بانگەوازەوەو، هیچیان نەسخ نەکراونەوە، قسەکەی جوانەو ئێمەش هەر ئەوەمان پێ ڕاستە.

٤ /ئەو قسەیەش کە لە عەبدوڵڵای کوڕی عەبباسەوە هێنامان، باشترین تەفسیرە بۆ ئەو ڕستە قورئانییە، کە پێشتر باسمانکرد.

٥ /دەشگونجێ مەبەستی کافرەکان ئەو جۆرە ئایەتانە بووبن، بۆ وێنە:

یەك) خوا دەفەرموێ: ﴿ وَٱلْمَلَٰٓئِكَةُ يُسَبِّحُونَ بِحَمْدِ رَبِّهِمْ وَيَسْتَغْفِرُونَ لِمَن فِى ٱلْأَرْضِ ٱلْحَكِيمُ .. ﴿٥﴾ ﴾الشوری، واتە: فریشتەکان بە ستایشکردنەوە پەروەردگاریان بە پاك دەگرن و، بۆ ئەوانەی لەسەر زەویین داوای لێبوردن دەکەن، (بۆ ئەوانەی لەسەر زەویین، واتە: بۆ هەموویان).

بەڵام لە سوورەتی (**غافر**)دا، دەفەرموێ: ﴿ ٱلَّذِينَ يَحْمِلُونَ ٱلْعَرْشَ وَمَنْ حَوْلَهُۥ يُسَبِّحُونَ بِحَمْدِ رَبِّهِمْ وَيُؤْمِنُونَ بِهِۦ وَيَسْتَغْفِرُونَ لِلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ... ﴿٧﴾ ﴾، ئەوانەی عەرشی خوایان هەڵگرتووەو، ئەوانەی لە دەوریشینی، بە ستایشکردنەوە پەروەردگاریان بە پاك دەگرن و، بڕوای پێ دێنن و، داوای لێبوردن بۆ ئەوانە دەکەن، کە بڕوایان هێناوە.

دەگونجێ گوتبێتیان: پێشێ دەفەرموێ: فریشتەکان بۆ تێکڕای خەڵکی سەر زەوی داوای لێبوردن دەکەن، دوایی دەفەرموێ: بۆ ئەوانەی کە بڕوایان هێناوە، ئەو دووەش تێکدەگیرێن!

بەڵام لە ڕاستییدا تێکناگیرێن، چونکە فریشتەکان ئەگەر {داوای لێبوردن کردن، بۆ مرۆڤەکان و جندیش} داوای هیدایەت و، داوای ئەوە بێ کە خوا بەزەیی بە بەندەکانی دابێ و هیدایەتیان بدات و، بەرنامەیان بۆ بنێرێ، ئەوە هەموویان دەگرێتەوە، بەڵام ئەگەر مەبەست ئەوەبێ کە: خوا لە گوناهیان ببوورێ و، هیدایەتی تایبەتیان بدات، بێگومان مەبەست پێی ئەوانەیە کە بڕوادارن، کەواتە: تێکگیران نیەو، هەر کامیان چەمکێکی جیاواز لەوی دیکەی هەیە.

دەشگونجێ بگوترێ ﴿وَيَسْتَغْفِرُونَ لِمَن فِي الْأَرْضِ ﴿٥﴾﴾الشوری، واتە: (يَستغفِرُونَ لِمَن فِي الأَرضِ مِن أَهلِ الإِيمَانِ)، واتە: داوای لێبووردن بۆ خەڵکی سەرزەوی دەکەن، بۆ ئەوانەیان کە بڕواداران.

دوو) یاخود لەوانەیە کافرەکان مەبەستیان مەسەلەیەکی وەك ئەم دوو ئایەتە بێ، ئایەتی ژمارە: (١٨) لە سوورەتی: (فاطر): ﴿وَلَا تَزِرُ وَازِرَةٌ وِزْرَ أُخْرَىٰ كُلٌّ.. ﴿١٨﴾﴾، واتە: هیچ گوناهبارێك گوناهی یەکێکی دیکە هەڵناگرێ، هەروەها ئایەتی (٢٥) سوورەتی (النحل): ﴿لِيَحْمِلُوا أَوْزَارَهُمْ كَامِلَةً يَوْمَ الْقِيَامَةِ وَمِنْ أَوْزَارِ الَّذِينَ يُضِلُّونَهُم بِغَيْرِ عِلْمٍ ﴿٢٥﴾﴾، واتە: با گوناهەکانی خۆیان بە تەواویی هەڵبگرن لە ڕۆژی قیامەتداو، هەندێك لە گوناهی ئەوانەش کە بە نەزانیی گومڕایان دەکەن.

لە سوورەتی (فاطر)دا، دەفەرموێ: هیچ گوناهبارێك گوناهی کەسی دیکە هەڵناگرێ و، لە سوورەتی (النحل)یشدا دەفەرموێ: با گوناهەکانی خۆیان بە تەواویی هەڵبگرن و، لە گوناهی ئەوانەش کە گومڕایان دەکەن!

دەڵێین: ئەوەش دیسان تێکگیران نیە، چونکە لە سوورەتی (فاطر)دا، دەفەرموێ: هیچ گوناهبارێك گوناهی کەسێکی دیکە هەڵناگرێ، گوناهەکانی لە کۆڵ بکاتەوە، بڵێ: وەرە گوناهەکانی خۆت بخە سەر پشتی من، وەك خوا لە سوورەتی (العنکبوت)دا دەفەرموێ: ﴿وَقَالَ الَّذِينَ كَفَرُوا لِلَّذِينَ آمَنُوا اتَّبِعُوا سَبِيلَنَا وَلْنَحْمِلْ خَطَايَاكُمْ وَمَا هُم بِحَامِلِينَ مِنْ خَطَايَاهُم مِّن شَيْءٍ إِنَّهُمْ لَكَاذِبُونَ ﴿١٢﴾ وَلَيَحْمِلُنَّ أَثْقَالَهُمْ وَأَثْقَالًا مَّعَ أَثْقَالِهِمْ وَلَيُسْأَلُنَّ يَوْمَ الْقِيَامَةِ عَمَّا كَانُوا يَفْتَرُونَ ﴿١٣﴾﴾.

واتە: کافرەکان بەوانەیان گوت کە بڕوایان هێناوە: شوێن ڕێبازەکەمان بکەون و، گوناهەکانتان لە کۆڵ دەکەینەوە (بۆتان لە کۆڵ دەنێین)، خواش دەفەرموێ: گوناهەکانیان لە کۆڵیان ناکەن، لە کۆڵیان ناخەن و، درۆ دەکەن، دوایی دەفەرموێ: قورساییەکانی خۆیان هەڵدەگرن و، لەگەڵ قورساییەکانی خۆیاندا، قورساییانی دیکەش هەڵدەگرن، واتە: کە پێشێ دەفەرموێ: گوناهەکانیان هەڵناگرن، یانی: لە کۆڵ وانیان ناخەن، کە ئەوان هیچیان لەسەر پشتێ نەمێنێ، دوایی کە دەفەرموێ: قورساییەکانی خۆیان هەڵدەگرن و، لەگەڵ قورساییەکانی خۆیاندا، قورسایی دیکەش هەڵدەگرن، هەروەها لێرەش دا کە دەفەرموێ: ﴿وَمِنْ أَوْزَارِ الَّذِينَ يُضِلُّونَهُم بِغَيْرِ عِلْمٍ... ﴿٢٥﴾﴾النحل، هەروەها لە گوناهە قورسەکانی ئەوانەش کە بە نەزانیی گومڕایان دەکەن، هەڵدەگرن...

واتە: ئەو کەسانەی کە خەڵك گومڕا دەکەن، گوناهەکان لە کۆڵ وان ناخەن، (لە کۆڵ گومڕا کراوەکان) بەڵکو گومڕا کراوەکان، گوناهەکانی خۆیان هەر لە ئەستۆی خۆیانن، بەڵام گومڕاکەرەکان بەهۆی گومڕاکردنی ئەوانەوە، لە گوناهەکانی ئەواندا بەشدارن، واتە: گومڕاکراوەکان چەندە گوناهە هەڵدەگرن، هێندەش گوناهە دەکەوێتە سەر پشتی ئەوانەی کە گومڕایان کردوون، بەبێ ئەوەی کە لە گوناهی ئەوان کەم بێتەوە، وەك پێشتریش لەوبارەوە فەرمایشتی پێغەمبەرمان ﷺ هێنا، ئنجا بۆ چاکەش هەر وایە: ئەوانەی کە ڕێنمایی خەڵك دەکەن بۆ چاکە، خۆشیان پاداشتی چاکەکەی خۆیان هەیە، کە دەیکەن و، دەبنە سەر مەشق بۆ خەڵك و، لە چاکەی ئەوانەش دا کە شوێنیان دەکەون، پشکدارو بەشدارن، بەڵام بەبێ ئەوەی کە لە چاکەی ئەوان کەم بێتەوە، هەروەها بۆ خراپەش: گوناهەکانی خۆشیان هەڵدەگرن و، گوناهی ئەوانەش کە گومڕایان کردوون، بەبێ ئەوەی کە لە گوناهی ئەوانیش کەم بێتەوە، بەڵکو بە قەدەر ئەوان گوناهیان دەگاتێ.

**سێ)** هەروەها دەگونجێ مەبەستیان پێ تێکگیرانی، ئەم دوو ئایەتە، بوو بێت:

أ /﴿ وَلَا يُسْـَٔلُ عَن ذُنُوبِهِمُ ٱلْمُجْرِمُونَ ۝٧٨ ﴾القصص، واتە: تاوانباران لە گوناهەکانیان لێیان ناپرسرێتەوە.

**ب** / سوورەتی: **(الصافات)**یشدا، خوا دەفەرموێ: ﴿ وَقِفُوهُمْ إِنَّهُم مَّسْـُٔولُونَ ۝٢٤ ﴾، واتە: ڕایان بگرن لێپرسراون، لێیان دەپرسرێتەوە.

لەوانەیە وایان زانیبێ کە ئەو دوو ئایەتە تێکدەگیرێن، بەڵام، نا، بەڵکو مانایەکەیان بەمجۆرەیە:

**أ** - تاوانباران لێیان ناپرسرێتەوە، ئایا ئەو گوناهەتان کردوە، یان نا ؟!، واتە: **(لا يُسألُونَ سُؤالَ استفْهَامٍ)**، ئایا گوناهت کردوە، یان نەتکردوە؟ ئەوەی لێی ناپرسرێ، چونکە فریشتەکان لەوسەری هاتوونەتەوە و، هەموو شتێکیان تۆمار کردوە.

**ب** - لە ئایەتەکەی سوورەتی **(الصافات)**یش دا کە دەفەرموێ: ﴿ وَقِفُوهُمْ إِنَّهُم مَّسْـُٔولُونَ ۝٢٤ ﴾، ڕایانگرن، لێپرسراون، بێگومان لێیان دەپرسرێتەوە، واتە: لێپرسینەوەی سەرزەنشتکردن و سەرکۆنەکردن، بەمجۆرە: ئەدی ئەوەت نەکرد؟ ئەوەشت نەکرد؟ ئەوەشت نەکرد؟ نەك مەبەست ئەوەبێ وەڵامەکەی وەربگرنەوە.

**چوار)** هەروەها ڕەنگە مەبەستیان ئەو دوو ئایەتە بێ:

أ / لە سووڕەتی (**الأحقاف**)دا، خوا دەفەرموێ: ﴿ وَمَآ أَدۡرِي مَا يُفۡعَلُ بِي وَلَا بِكُمۡۖ إِنۡ.. ﴿٩﴾ ﴾ واتە: من نازانم ئێوەش و منیش چیمان پێ دەکرێ، سەرەنجاممان چی دەبێ !

ب/ بەڵام لە سووڕەتی: (**القلم**)دا، خوا دەفەرموێ: ﴿ وَإِنَّ لَكَ لَأَجۡرًا غَيۡرَ مَمۡنُونٖ ﴿٣﴾ ﴾، واتە: بە دڵنیایی تۆ پاداشتێکی نەبڕاوەت هەیە، ئەوە بەنسبەت (موحەممەد)ەوە، بەنسبەت تاوانبارەکانیشەوە، خوا دەفەرموێ: ﴿ إِنَّ ٱلۡمُجۡرِمِينَ فِي ضَلَٰلٖ وَسُعُرٖ ﴿٤٧﴾ ﴾القمر، واتە: بێگومان تاوانباران لە گومڕایی و لە بڵێسەدان، کەواتە: لەوێ دیاریی کردوە کە: تاوانباران لە گومڕایی و بڵێسە دان و، دیاریشی کردوە کە پێغەمبەر ﷺ پاداشتی نەبڕاوە هەیە، کەچی لە سووڕەتی (**الأحقاف**)دا دەفەرموێ: نازانم نە ئێوەو نە من، چیمان پێ دەکرێ! پێیان وابووە: ئەوە تێکگیرانە.

بەڵام: نا، بەڵکو یانی: وەك سەرەنجامی دنیایی، نازانین بەرەو چی دەچین و، سەرەنجامی کارە دنیاییەکەمان چی دەبێ! بەڵام بەنسبەت دواڕۆژەوە، سەرەنجامەکە مسۆگەرو مەعلووم و عەیانە، کە پێغەمبەر ﷺ پاداشتی نەبڕاوەی هەیە و، ئیماندارانیش، بەڵام تاوانباران لە سزادان.

٥- ﴿ قُلْ نَزَّلَهُ رُوحُ الْقُدُسِ مِن رَّبِّكَ بِالْحَقِّ ﴾، بلێ: ﴿ رُوحُ الْقُدُسِ ﴾، لە پەروەردگارتەوە بە هەق دایبەزاندوە.

( بِالْحَقِّ ): (**مُتَلَبِّسا بالحَقِّ لا شَائِبة للباطِلِ فِيهِ**)، واتە: ئەو قورئانەی جیبریل دایبەزاندوە، ئاوێتەیە لەگەڵ هەق داو، هیچ خلتەی ناهەقی تێدا تێکەڵ نەبووە.

﴿ رُوحُ الْقُدُسِ ﴾، یانی: جیبریل (**القُدُسُ: الطُّهْرُ مِنْ إضَافَةِ الصِّفَةِ إلى المَوصُوفِ مِثْلُ: حَاتَمِ الجُود، وَالمُرَادُ: حَاتَمُ الجَوَاد، فَالمَعنَى الرُّوحُ المُقَدَّس، أو المَلَكُ المُقَدَّس**)، (**قُدُس**) واتە: پاکیی، ئەمە لە پاڵدانی سیفەتە بۆ لای وەسفکراو، وەك (**حَاتَمُ الجُود**)، کە مەبەست پێی (**حَاتَمُ الجَواد**)ە، حاتەمی بەخشندە، بەڵام لە زمانی عەرەبییدا ئەگەر بیانەوێ زۆر زێدەڕۆیی تێدا بکەن، گوتوویانە: (**حَاتَمُ الجُود**)، حاتەمی بەخشندەیی، کە لە ئەصڵدا (**حَاتَمُ الجَواد**)ە، حاتەمی بەخشندە.

لێرەشدا ﴿ رُوحُ الْقُدُسِ ﴾، واتە: (**الرُّوحُ المُقَدَّس**)، یانی: ئەو ڕووحەی پاکەو، بێ هەڵەو کەموکوڕییە، کە (**جبريل**)ە، (**عليه السلام**) و، فریشتەکانیش هەموویان بێ گوناهو بێ هەڵەن، خوا وای خوڵقاندوون.

٦- ﴿ لِيُثَبِّتَ الَّذِينَ آمَنُوا ﴾، تاکو بەهۆی قورئانەوە، ئەوانەی کە بڕوایان هێناوە، زیاتر دڵ دامەزراو و چەسپاویان بکات.

٧- ﴿ وَهُدًى وَبُشْرَىٰ لِلْمُسْلِمِينَ ﴾، هەروەها قورئان و ڕێنمایی و، موژدەشە بۆ مسوڵمانان.

لێرەدا خوا عزّ و جلّ دەیتوانی بفەرموێ: (**وَهُدىً وَّ بُشرى لَهُم**)، چونکە پێشێ باسی بڕواداران کراوە: ﴿ لِيُثَبِّتَ الَّذِينَ آمَنُوا ﴾، بەڵام خوا ﷻ لێرەدا لە جێی ڕاناو (**ضمير**) ناوێکی ئاشکرای داناوە، (**جَعَلَ المُظْهَرَ مَحَلَّ المُضْمَر**)، بۆ ئەوەی بزانرێ: ئەوانەی بڕوایان هێناوە، یەکێك لە سیفەتە بنچینەیەکانیشیان بریتیە لە ملکەچیی، ئەوانەی کە ملکەچن بۆ خوا، دەڵێ: (**الإظْهَارُ لِزِيادَةِ مَدْحِهِم بِوَصْفٍ أخَرَ شَرِيفٍ**)، بۆ ئەوەی بە وەسفێکی دیکەی بەرز مەددحیان بکات.

مەسەلەی سێیەم:

**خوا دەفەرموێ: بە دلنیایی ئێمە دەزانین کە کافرەکان دەڵێن: بەشەرێك (موحەممەد) فێری قورئان دەکات! بەڵام زمانی ئەوەی لادانی بەلادا دەکەن: ئەعجەمییە، ئەم قورئانەش بە زمانێکی عەرەبی ڕۆشنە! {کەواتە: ناگونجێ قورئانێك بە زمانێکی عەرەبی ڕۆشن هاتبێ، کەسێك فێری پێغەمبەری ﷺ کردبێ کە خۆی عەرەبی نازانێ}:**

خوا دەفەرموێ: ﴿وَلَقَدْ نَعْلَمُ أَنَّهُمْ يَقُولُونَ إِنَّمَا يُعَلِّمُهُۥ بَشَرٌۗ لِّسَانُ ٱلَّذِى يُلْحِدُونَ إِلَيْهِ أَعْجَمِىٌّ وَهَٰذَا لِسَانٌ عَرَبِىٌّ مُّبِينٌ ۝١٠٣﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتە، لە سێ بڕگەدا:

١- ﴿وَلَقَدْ نَعْلَمُ أَنَّهُمْ يَقُولُونَ إِنَّمَا يُعَلِّمُهُۥ بَشَرٌۗ﴾، بە دڵنیایی ئێمە دەزانین کە ئەوان دەڵێن: مرۆڤێك فێری دەکات، شارەزایانی زمان گوتوویانە:{**إفتِتَاحُ الجُمْلَةِ بِلامِ القَسَمِ وَ (قَدْ) يُشِيرِ إلى أَنَّهُ كانَ هُناكَ نَوْعٌ مِنَ الإِخْفَاءِ لِهَذَا القَول**}.

کە دەفەرموێ: ﴿وَلَقَدْ نَعْلَمُ﴾، هەم (ل) بۆ سوێند پێ خواردن، یان بۆ تەئکید کردنەوەیە، (قَد)یش دیسان بە هەمان شێوە، بۆ دڵنیا کردنەوەیە، ئنجا کە ئەو دووانەی خستۆتەسەر: ﴿وَلَقَدْ نَعْلَمُ﴾، بە دڵنیایی ئێمە دەزانین: ﴿أَنَّهُمْ يَقُولُونَ إِنَّمَا يُعَلِّمُهُۥ بَشَرٌۗ﴾، کە ئەوان دەڵێن تەنیا مرۆڤێك فێری (قورئانی) دەکات، ئەمە ئەوە دەگەیەنێ کە جۆرێك لە شاردنەوە هەبووە بۆ ئەو قسەیە، یانی: خوا ﷻ ویستوویەتی پەردە لەسەر ئەو قسەیە هەڵماڵێ، کە: ڕەنگە بە جۆرێك لە تاکتیك و فێڵ لە بەینی خۆیاندا گوتبێتیان: وەرن! با بزانین داخۆ باسی کێ بکەین، ڕێی تێبچێ، بۆ چەواشەکردنی خەڵکی عەوام، بڵێین: کە ئەو کەسە موحەممەدی فێری ئەو قورئانە کردوە ؟!

٢- ﴿لِّسَانُ ٱلَّذِى يُلْحِدُونَ إِلَيْهِ أَعْجَمِىٌّ﴾، خوا ﷻ بە بەرپەرچدانەوەیەکی دداشکێن بەرپەرچیان دەداتەوە، دەفەرموێ: زمانی ئەوەی کە مەیلی بەلادا دەکەن، یان بەلایدا لادەدەن، زمانێکی ئەعجەمییە، واتە: غەیری عەرەبی، ( أَعْجَمِىٌّ )، {**مَنسُوبٌ إلى الأعجَم**}، (أعجم)یش واتە: زمانێکی ناڕوون، بە نسبەت عەرەبانەوە، زمانێك کە غەیری عەرەبی بوو بێ، ناڕوون و نامۆ بووەو، تێی نەگەیشتوون.

٣- ﴿ وَهَٰذَا لِسَانٌ عَرَبِيٌّ مُّبِينٌ ﴾، بەڵام ئەمە، (واتە: ئەم قورئانە)، بە زمانێکی عەرەبی ڕۆشنە، لێرەدا (اللِّسان: الكَلامُ ، سُمِّيَ الكَلام باسمِ آلتِهِ)، (لسان): ئەو زمانەیە کە ئینسان قسەی پێ دەکات و، شتی پێ دەخوات، بەڵام لێرەدا {قسەکردن} بە ناوی ئامرازەکەی خۆیەوە کە زمانە، ناونراوە.

کە دەفەرموێ: ( يُلْحِدُونَ )، واتە: (يَعترِضونَ وَيَعدِلونَ إِلَيهِ)، ڕەخنەی پێدەگرن و بەلایدا لادەدەن، ئەمە دوو شێوە خوێندنەوەی هەن: (يُلْحِدُونَ ) و (يَلحِدُونَ)، هەردووکیان بە مانای (يَمِيلُونَ إِلَيهِ)، بەلایدا لادەدەن.

## قسەیەك دەربارەی ئەو کەسەی گوایە: پێغەمبەری ﷺ فێری قورئان کردوە!

لە تەفسیرەکاندا ناوی چەند کەسێك هاتوە، بۆ وێنە:

١/(الطَّبَرِي) دەڵێ: (غُلَامٌ كانَ قَيْناً اسْمُهُ: بَلْعَام، كانَ نَصْرَانِياً)، واتە: (غوڵامێك) کۆیلەیەك بووە، ئاسنگەر بووە، ناوی بەلعام بووەو، نەصڕانیی بووە.

٢/ هەر (الطبري) لە ڕیوایەتێکی دیکەدا دەڵێ: (كانَ اسْمُهُ يَعِيش)، ناوی (يعيش) بووە ، واتە: دەژی.

٣/ هەر (الطبري) لە ڕیوایەتێکی دیکەدا دەڵێ: (كانَ اسْمُهُ جَبْر)، ناوی جەبر بووە.

٤/ دیسان (الطبري) لە ڕیوایەتێکی دیکەدا دەڵێ: دوو غوڵام بوون، یەکێکیان ناوی (يَسار) بووە، یەکێکیان ناوی (جَبْر) بووە، کە پێشتر لە هۆی هاتنە خوارەوەشیدا باسمانکرد.

٥/ هەروەها (الطبري) لە ڕیوایەتێکی دیکەدا دەڵێ: گوایە گوتوویانە: سەلمانی فارسیی فێری دەکات، بەڵام دەڵێ: ئەوەیان هەر ناگونجێ، چونکە سەلمانی فارسیی لە مەدینە مسوڵمان بووە، ئەمە هەمووی (الطبري) هێناویەتی[1].

٦/ (الشَّعراوي) یەکێکی دیکەش دێنێ، ئەویش هەر لە تەفسیرەکاندا هاتوە، کە دەڵێ: غوڵامێك بووە، ناوی (عَدّاس) بووەو، نەصڕانیی بووە.

بەڵام وەك گوتمان: خوا ﷻ بەرپەرچێکی ددان شکێنیان دەداتەوە، چونکە ئێستاش ئەو تۆمەتە هەر ئاڕاستەی قورئان و، پێغەمبەری خوا دەکرێ ﷺ گوایە: کەسێك لە مەککە بووە، {ئنجا ئاسنگەر بووە، نەصڕانیی بووە، هەر چی بووە، کەسێك بووە، دووان بوون، ناویان چی بووە؟ چۆن بووە ؟} ئەو کەسە قورئانی فێری پێغەمبەر کردوە ﷺ !!

---

(١) جَامِعُ البَيان: ج ١٤، ص ١٨٣ - ١٨٥.

بەڵام لەڕاستییدا، ئەو قسانە هی کەسێکن کە شارەزای قوڕئان نەبێ و، قوڕئانی نەخوێندبێ، یان خوێندبی و تێی نەگەیبێ، ئەگەرنا کەسێك لە قوڕئان شارەزا بێ، دەزانێ ئەو تۆمەتە هێندە پووچە، تەنیا بیستنی بەسە، بۆ زانیی پووچەتییەکەی، ئاخر: هەرچی ڕەوانبێژان و زمان پاراوانی عەرەب بوون، لە بەرانبەر قوڕئاندا بە چۆکدا هاتوون و، ئێستاش لە بەرانبەریدا بە چۆکدا دێن!

بەڵێ هەر کەسێك تەماشای قوڕئان بکات، دەزانێ کە: جگە لە خوا هیچ کەس ناتوانێ، فەرمایشتی وا بفەرموێ، لە هەموو ڕوویێکەوە:

١- لە ڕووی ئیعجازی مێژووییەوە، تەماشای دەکەی.

٢- لە ڕووی ئیعجازی عیلمیەوە ، تەماشای دەکەی.

٣- لە ڕووی ڕوانبێژیی (**بلاغة**)یەوە، تەماشای دەکەی.

٤- لە ڕەوانیی (**فصاحة**)یەوە، تەماشای دەکەی.

٥- لە ڕووی دەروونناسییەوە.

٦- لە ڕووی یاساناسییەوە.

٧- لە ڕووی کۆمەڵناسییەوە.

٨- لە ڕووی یاسا عەقڵییەکانەوە.

٩- لە ڕووی تێرکردنی داخوازییە سروشتییەکانەوە... هتد.

وەك من لەو مەوسووعە عەڕەبییەدا[1] کە لە زیندانی ئەمەریکاییەکاندا نوسیوومە، باسی ڕووەکانی ئیعجازی قورئانم کردوە، کە دە (١٠) ڕووم لە ڕووە ئیعجازییەکانی قوڕئان باس کردوون، بەڵام گوتوومە: ڕووەکانی ئیعجازی قوڕئان نایەنە ژمارە، چونکە: قوڕئان بۆ هەموو بەشەر هاتوە، کەواتە: دەبێ بۆ هەموو بەشەر دەستە و سانکەر بێ، هەر کەسە لە بواری شارەزایی و پسپۆڕیی خۆی دا، بەڵێ کەسێك تەماشای قوڕئان بکات و لێی تێ بگات، ئەوە زۆر بە ڕوونیی دەبینێ، کە: قوڕئانێکی ئاوا ناگونجێ بەشەر بیفەرموێ، نە موحەممەد ﷺ و، نە غەیری موحەممەدو، نە ئەعجەمیی و، نە عەرەبیی و، نە هیچ کەس.

---

(١) بڕوانە: {الكتاب الخامس: الإيمان بكتب الله عزّ وجلّ} ط ٢، ٢٠١٨ م.

**مەسەلەی چوارەم و کۆتایی:**

**خـوا (عَـزَّ وَجَـلّ) ڕایگەیانـدوە، کـە ئەوانـەی بـڕوا بـە ئایەتـەکانی خـوا ناهێنـن، نایانخاتـە سـەر ڕێـی ڕاسـت و، ئازارێـکی بەئێشـیان هەیـە و، تەنیـا ئەوانـەش درۆ هەڵدەبەسـتن بەنـاوی خـواوە کـە بڕوایـان بـە ئایەتـەکانی نیـە و، هـەر ئەوانـەش درۆزنی ڕاسـتەقینەن:**

خوا دەفەرمـوێ: ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ بِـَٔايَـٰتِ ٱللَّهِ لَا يَهْدِيهِمُ ٱللَّهُ وَلَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴿١٠٤﴾ إِنَّمَا يَفْتَرِى ٱلْكَذِبَ ٱلَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ بِـَٔايَـٰتِ ٱللَّهِ ۖ وَأُو۟لَـٰٓئِكَ هُمُ ٱلْكَـٰذِبُونَ ﴿١٠٥﴾ ﴾.

## شیکردنەوەی ئەم دوو ئایەتە، لە چوار بڕگەدا:

١- ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ بِـَٔايَـٰتِ ٱللَّهِ لَا يَهْدِيهِمُ ٱللَّهُ ﴾، بە دڵنیایی ئەوانەی بڕوا بە ئایەتەکانی خوا ناهێنن، خوا نایانخاتە سەر ڕاستە ڕێ.

لێـرەدا مەبەسـت لـە هیدایـەت، هیدایـەتی تایبەتـە، واتـە: ڕاسـتە ڕێیـان نـاکات، نایانخاتـە سـەر ڕاسـتە ڕێ، ئەگەرنـا کەسـێك ئیـمان بـە ئایەتـەکانی خـوا بێنـێ، یـان ئیـمان بـە ئایەتـەکانی خـوا نەهێنـێ، خـوا بـە واتـای گشـتی هیدایـەت، هیدایـەتی داون، بەرنامـەی خـۆی خسـتۆتە بەرچاویـان، بـەڵام یـانی: هیدایـەتی تایبەتییـان نـادات، ئاخـر کەسـێك ئیـمان نەهێنـێ، خـوا چـۆن ڕاسـتە ڕێـی دەکات؟

٢- ﴿ وَلَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴾، هەروەها ئەوانە ئازارێکی بە ئێشیان بۆ هەیە، واتە: ئەوانەی کە نایانەوێ مسوڵمان بن، خوا زۆریان لێناکات، ئەوانەی کە ئیمان بە ئایەتەکانی خوا ناهێنن و، ئارەزووی هەقیان نیە، ﴿ لَا يَهْدِيهِمُ ٱللَّهُ ﴾، خوا نایانخاتە سەر ڕاستە ڕێ، بە زۆر مسوڵمانیان ناکات.

٣- ﴿ إِنَّمَا يَفْتَرِى ٱلْكَذِبَ ٱلَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ بِـَٔايَـٰتِ ٱللَّهِ ﴾، بێگومان تەنیا ئەوانە درۆ هەڵدەبەستن بە ناوی خواوە، کە بڕوا بە ئایەتەکانی خوا ناهێنن.

٤- ﴿ وَأُو۟لَـٰٓئِكَ هُمُ ٱلْكَـٰذِبُونَ ﴾، هەر ئەوانەش درۆزنن، واتە: درۆزنی ڕاستەقینە هەر ئەوانەن، کە بە ناوی خواوە درۆ هەڵدەبەستن، پێغەمبەر ﷺ ناگونجێ، درۆ بکات و شت بەناوی خواوە هەڵبەستێ، چونکە:

**یەکەم:** بڕوا بە ئایەتەکانی خوا دێنێ.

**دووەم:** پێغەمبەر ﷺ ئەصڵەن پێش پێغەمبەرایەتییش درۆی لێ ئەزموون نەکراوەو درۆی نەکردوە.

**سێیەم:** ئێستاش لە دوای پێغەمبەرایەتیی ﷺ ئەگەر تەماشای ژیانی بکرێ، هەموو ژیانی زۆر ڕوون و ئاشکرا و بێ گرێ و گۆڵە و، لەگەڵ خواو، لەگەڵ خۆی و لەگەڵ خەڵکدا، ڕێك و ڕاست بووە.

کەواتە:

**١)** ئەوە، دڵدانەوەیە بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ.

**٢)** بەرچاو ڕوونییە بۆ ئیمانداران.

**٣)** بەرپەرچدانەوەیە بۆ ئەهلی کوفر، کە تەنیا ئەوانەی بڕوا بە ئایەتەکانی خوا ناهێنن، ئەوانەن دەتوانن درۆ هەڵبەستن بە ناوی خواوەو، هەر ئەوانەش درۆزنی ڕاستەقینەن، بەڵام بابایەکی وەك پێغەمبەری خاتەم ﷺ کە باشترین کەسەو، لە لووتکەی بەرزی ڕاستگۆیی و ڕێك و ڕاستیی دایە، لەگەڵ خۆی و، لەگەڵ خواو، لەگەڵ خەڵکدا، ناگونجێ درۆ بە ناوی خواوە هەڵبەستێ، ئنجا وەك پێشتریش گوتمان: ئەوانەی کە باسی پێغەمبەرایەتیی دەکەن:

**أ** - یان دەبێ خراپترین کەس بن.

**ب** - یان دەبێ باشترین کەس بن.

کە بەڕاستیی پێغەمبەرن بوون، باشترین ئەوانەش کە بە درۆ ئیدیعای پێغەمبەرایەتییان کردوە، بێگومان خراپترین کەس بوون.

دەشگونجێ ئەم ئایەتە موبارەکە مەبەست پێی ئەوانەبێ کە: هەر لە بیانوو دەگەڕێن، بۆ نموونە: وەلیدی کوڕی موغیرە، کە نەیویستوە ئیمان بێنێ، هەمیشە لە بیانوو گەڕاوە بۆ ئەوەی ئیمان نەهێنێ، بۆیە خواش نەیخستۆتە سەر ڕاستە ڕێ، بەڵام پیاوێکی وەك عومەری کوڕی خەتتاب، کە ئەویش وەك وەلیدی کوڕی موغیرە لە سەرەتاوە دژی ئیسلام بووەو، دژی پێغەمبەر ﷺ بووە، بەڵام چونکە بڕیاری نەداوە: کە ئەگەر هەقیش بناسێ، هەر شوێنی نەکەوێ و، بڕوای پێ نەهێنێ، بۆیە کە هەقی نەناسیوەو، هەقی بۆ دەرکەوتوە، بێ وەخران[١]، تەماشا دەکەی یەکسەر لە باوەشی گرتوە، ئنجا ئا ئەوانەی کە ئیمان دێنن و لە ئیمانێ دەگەڕێن، لە ئیمانێ دەخەفتێن، خوا دەستیان دەگرێ و، دەیانخاتە سەر ڕاستە ڕێ، بەڵام کەسانێك کە نایانەوێ بڕوا بێنن، بێگومان خوا نایانخاتە سەر ڕاستە ڕێ و زۆریان لێ ناکات.

**سُبْحَانَك اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ، أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ، أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ**

---

(١) بێ وەخران: بێ دواکەوتن، بێ تاخیر بوون.

## پێناسەی ئەم دەرسە

لەم دەرسەماندا شەش (٦) ئایەت تەفسیر دەکەین، ئایەتەکانی (١٠٦ - ١١١)، کە تەوەری سەرەکییان بریتیە لە باسی هەڵگەڕانەوە لە ئیسلام و، سەرەنجامی شوومی هەڵگەڕاوان لە دنیا و لە دواڕۆژیشدا.

ئنجا خوا باسی ئیماندارانێکی ئەشکەنجەدراوی ناچاری کۆچ و کۆچبارکرانی کردوە و، کراوەتە تەواوکەری ئەو بابەتە، چونکە بێگومان بەهۆی فشارو ئەشکەنجەی کافرە ستەمکارەکانەوە، کاتی خۆی دوو جاران مسوڵمانانی چەوسێنراوە، ناچاری کۆچ و کۆچبار کراون، لە مەککەوە بۆ (یثرب) کە سەرەنجام پێغەمبەریش بە یەکجاریی کۆچی کردوە، لەگەڵ ئەبووبەکریی هاوەڵی دا، خوا لێی ڕازی بێ و، سەرەنجام لەوێ: قەوارەی سیاسیی ئیسلام ڕاگەیەنراوە.

﴿ مَن كَفَرَ بِٱللَّهِ مِنۢ بَعۡدِ إِيمَٰنِهِۦٓ إِلَّا مَنۡ أُكۡرِهَ وَقَلۡبُهُۥ مُطۡمَئِنُّۢ بِٱلۡإِيمَٰنِ
وَلَٰكِن مَّن شَرَحَ بِٱلۡكُفۡرِ صَدۡرٗا فَعَلَيۡهِمۡ غَضَبٞ مِّنَ ٱللَّهِ وَلَهُمۡ عَذَابٌ عَظِيمٞ ﴿١٠٦﴾
ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمُ ٱسۡتَحَبُّواْ ٱلۡحَيَوٰةَ ٱلدُّنۡيَا عَلَى ٱلۡأٓخِرَةِ وَأَنَّ ٱللَّهَ لَا يَهۡدِي ٱلۡقَوۡمَ
ٱلۡكَٰفِرِينَ ﴿١٠٧﴾ أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ طَبَعَ ٱللَّهُ عَلَىٰ قُلُوبِهِمۡ وَسَمۡعِهِمۡ وَأَبۡصَٰرِهِمۡۖ
وَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡغَٰفِلُونَ ﴿١٠٨﴾ لَا جَرَمَ أَنَّهُمۡ فِي ٱلۡأٓخِرَةِ هُمُ ٱلۡخَٰسِرُونَ ﴿١٠٩﴾
ثُمَّ إِنَّ رَبَّكَ لِلَّذِينَ هَاجَرُواْ مِنۢ بَعۡدِ مَا فُتِنُواْ ثُمَّ جَٰهَدُواْ وَصَبَرُوٓاْ إِنَّ
رَبَّكَ مِنۢ بَعۡدِهَا لَغَفُورٞ رَّحِيمٞ ﴿١١٠﴾ يَوۡمَ تَأۡتِي كُلُّ نَفۡسٖ تُجَٰدِلُ عَن نَّفۡسِهَا وَتُوَفَّىٰ كُلُّ
نَفۡسٖ مَّا عَمِلَتۡ وَهُمۡ لَا يُظۡلَمُونَ ﴿١١١﴾ ﴾

## مانای دەقا و دەقی ئایەتەکان

{هەر کەس دوای بڕواهێنانی بە خوا، بێبڕوا بێتەوە، - مەگەر کەسێك ناچار بکرێ و، دڵیشی بە ئیمان ئۆقرە گرتوو بێ -، بەڵام هەر کەس سینەو دڵی خۆی بۆ کوفر ئاوەڵا بکات، ئەوانە تووڕەییان لە خواوە دێتە سەر و، سزایەکی مەزنیان بۆ هەیە ﴿١٠٦﴾ ئەویش لە سۆنگەی ئەوەوە کە ژیانی دنیایان خۆشتر ویستوە و هەڵبژاردوە بەسەر ژیانی دوارۆژداو، (بەهۆی ئەوەشەوە) کە خوا کۆمەڵی کافران ڕاستە ڕێ ناکات، (و ئەوانەش بە کوفرەوە هاتوونە لای خوا) ﴿١٠٧﴾ ئەوانە کەسانێکن خوا مۆری بەسەر دڵەکانیان و بیستنیان و چاوەکانیانەوە ناوەو، هەر ئەوانەن بێ ئاگایان ﴿١٠٨﴾ بە دڵنیایی ئەوانە لە دوارۆژیشدا هەر خۆیان زیانباری ڕاستەقینەن ﴿١٠٩﴾ ئنجا بە دڵنیایی، پەروەردگارت لەگەڵ ئەوانەدا، کە دوای ئەشکەنجەو ئازاردران، کۆچیان کردوە، پاشان تێکۆشاون و خۆڕاگر بوون، بێگومان پەروەردگارت دوای ئەو کۆچکردن و تێکۆشان و خۆڕاگرییە، لێبوردەی میهرەبانە بەرانبەریان ﴿١١٠﴾ یاد بکەنەوە! ڕۆژێك هەر کەسە دێ بۆ بەرگریی لە خۆ کردن مشتومڕ دەکات و، هەر کەسە چی کردوە، بە تەواویی پاداشت و سزای خۆی وەردەگرێتەوە و، ئەوان هیچ ستەمیان لێناکرێ ﴿١١١﴾}.

## شیکردنەوەی هەندێک لە وشەکان

(أُكۡرِهَ): واتە: زۆری لێکراوەو، تۆبزیی لێکراوە، ناچار کراوە، (**الإكراه: حَمْلُ الإنسانِ عَلَى مَا يَكرهُهُ، الإكراهُ: الإلْجَاءُ إلى فِعْلِ مَا يَكرهُ فِعْلَهُ**)، (**إكراه**) بریتیە لەوە کە مرۆڤ شتێکی پێ بکرێ، کە پێی ناخۆش بێ، هەروەها (**إكراه**) بریتیە لەوەی کەسێك کارێکی پێ بکرێ و، پێی ناخۆش بێ، ئەو کارە بکات.

(مُطۡمَئِنُّۢ): (**الطَّمأْنِينَة وَالإطْمِئنان: السكُونُ بَعْدَ الإنْزِعَاجِ**)، وشەی (**طُمْأْنِيْنة وإطْمِئْنان**)، بریتیە لە ڕاوەستان و داسەکنان و ئۆقرە گرتن لە دوای جووڵەجووڵ.

(شَرَحَ بِٱلۡكُفۡرِ صَدۡرٗا): واتە: سینەی بۆ کوفر ئاوەڵا بۆتەوە، گوشاد بووە، (**أَصْلُ الشَّرْحِ: بَسْطُ اللَّحْمِ وَنَحْوِهِ، شَرَحْتُ اللَّحْمَ، وَشَرَّحْتُهُ، وَشَرْحُ الصَّدْرِ: بَسْطُهُ**) وشەی (شرح) لە ئەسڵدا ئەوەیە کە گۆشتێك لێك بکێشرێتەوە، پێشێ پێکەوە بێ، دواتر لێك جیابکرێتەوە، ئنجا گۆشت بێ، یان هەر شتێکی دیکە بێ، دەگوترێ: (**شَرْحْتُ اللَّحْمَ وَشَرَّحْتهُ**)، (**شَرْحُ الصَّدْر**) یش واتە: سینگ فراوان بوون، سینگ ئاوەڵا بوون، کە مەبەست پێی قبووڵکردنی ئەو شتەیە.

(ٱسۡتَحَبُّواْ ٱلۡحَيَوٰةَ ٱلدُّنۡيَا عَلَى ٱلۡأٓخِرَةِ): واتە: ژیانی دنیایان خۆشترویستوە لە دواڕۆژو بەسەریدا هەڵیانبژاردوە، {**استحَبُّوا: مُبالَغَةٌ فِي أَحَبُّوا، مِثْلُ: استأْخَرَ، وَضُمِّنَ استحَبُّوا مَعْنَى فَضَّلوا بحَرْف (عَلَى)**}.

(**استحَبُّوا**) زێدەڕۆییە لە (**أَحَبُّوا**)، (**أَحَبُّوا**) واتە: خۆشیانویستوە، (**استحَبُّوا**) واتە: زۆریان خۆشویستوە، وەك (**تَأَخَرَ، وَاستأْخَرَ**) کە (**إستأخَرَ**) ماناکەی بەهێزترە لە (**تأخُّر**)، (**وَضُمِّنَ استحَبُّوا مَعْنَى فَضَّلوا بحَرْفِ على**)، وشەی (**استحَبُّوا**) مانای (**فَضَّلوا**)ی خراوەتە نێو بەهۆی پیتی (**علىٰ**)ەوە، واتە: خۆشیانویستوەو هەڵیانبژاردوە، بەڵام چونکە وشەی (**استحَبُّوا**) بە پیتی (**على**) بەرکاری خواستوە، بەهۆی ئەوەوە ئەو مانایەی هەڵیانبژادوە (**آثَرُوا، أو فضَّلوا**)ی خراوەتە نێو.

(طَبَعَ ٱللَّهُ عَلَىٰ قُلُوبِهِمۡ): واتە: خوا مۆری بەسەر دڵەکانیانەوە ناوە، (**الطَّبْعُ: أَنْ تُصَوَّرَ الشيءَ بصُورَةٍ مَا كَطَبْعِ السكَّة، وَهُوَ أَعَمُّ مِنَ الخَتْمِ وَأَخَصُّ مِنَ النَّقْشِ،... وَبِهِ اعْتبِرَ**

**الطَّبْعُ وَالطَّبِيْعَـة الَّتـي هِـيَ السَّجية، فَـإِنَّ ذَلِـكَ هُـوَ نَقْـشُ النَّفْـسِ بصُـورَةٍ، إمَّـا مِـنْ حَيْـثُ الخِلْقَـة، أو مِـنْ حَيْـثُ العَـادَةَ...، وَيُتَجَـوَّز بالخَتْـمِ وَالطَّبْـعِ فِي الإسْـتِيْثَاقِ مِـنَ الـشيءِ، وَالمَنْـعُ مِنْـهُ، اعْتِبـارَاً بِمَـا يَحْصُـلُ مِـنَ المَنْـعِ بالخَتْـمِ عَـلَى الكُتُـبِ وَالأَبْـوَاب).**

وشـەی (**طَبْـع**) ئەوەیـە کـە شـتێك بـە وێنەیـەك وێنـا بکـەی، (وێنەیـەکی لەسـەر بکـەی، وەك دراو کـە نەخـشی لەسـەر دەکـرێ) (**طَبْـع**) لـە (**خَتْم**) گشـتییترەو لـە (**نَقْش**) (واتـە: نیـگار و وێنە)، تایبەتـترە، واتـە: وشـەی (**طَبْـع**) لـە نێـوان (**خَتْـم، وَنَقْـش**) دایـە، لـە ڕووی مانـاوە، کەواتـە: (**نَقْـش**) ماناکـەی زۆر فراوانـترە، ئنجـا لـە دوای ئـەو (**طَبْـع**) و، دواتـر (**خَتْـم**).

وشـەی (**طبـع، طبیعة**)یـش، واتـە: سروشـتێك، کـە مـرۆڤ لەسـەریەتی و خـوا لەسـەری ڕسـقاندوە، لەوێـوە هاتـوە، چونکـە سروشـتی مرۆڤیـش، ئـەو وێنەیەیـە کـە لەسـەری دانـراوە، چ لـە ڕووی سروشـتەوە، کـە خـوا وای خوڵقانـدوە {کەسـێك لـە ڕووی سروشـتەوە هـەر بـە تەبیعـەت تەنگـە پرێسـکەیە، زوو تـووڕە دەبـێ، کەسـێکی دیکـەش ئـارام و هێمنـە، یەکێـك پەلـە دەکات، یەکـێ بەکاوەخۆیـە.

یاخـود بەهـۆی نەرێـت و پەروەردەکـردن و دەوروبـەرو ژینگـەوە {ئـەو سروشـتەی بـۆ پەیدابووبـێ، خەڵـکی هەنـدێ شـوێنان، هەنـدێ وڵاتـان، هەنـدێ نەتـەوان، هەنـدێ سـیفەتیان تێدایـە، بۆتـە عـادەت و نەریتێـکی ڕۆچـوو}.

وشـەی (**ختـم، وطبـع**) بـە ڕێپێـدان (**تجوُّز**)، {واتـە: وەك خواسـتنەوەیەك} بەکاردەهێنرێـت بـۆ مەحکەمکـردنی شـتێك و، ڕێ لێگرتنـی، لەبەرئـەوەی: بەهـۆی خەتمـەوە کـە لە کتێـب و نامان، یاخـود لـە دەرگایـان دەدرێ، ڕێیـان لێگیـراوە بـەکار بهێنرێـن، واتـە: نامەیـەك کـە خەتـم کـرا بـێ و، نابـێ تەماشـا بکـرێ، جگـە لـە لایـەن کەسـێکەوە کـە بـۆی ڕەوانەکـراوە، هەروەهـا دەرگایـەك خەتـم کرابـێ ڕێ لـە چوونـە ژووری گیـراوە.

ئنجـا کـە خـوا دەفەرمـوێ: خـوا مـۆری بەسـەر دڵـەوە نـاون، واتـە: دڵیـانی داخسـتوەو وایلێکـردوون کـە ئیـمان نەچێتـە نێویـان.

( **فُتِـنُواْ** ): (**أَصْلُ الفَتْنِ: إدْخَـالُ الذَّهَـبِ النار لِتَظْهَـرَ جَوْدَتـهُ مِـنْ رَدَائَتِـه، وَاسـتعْمِلَ فِي إدْخَـالِ الإنْسـانِ النـار: ﴿ ذُوقُواْ فِتْنَتَكُمْ ﴿١٤﴾ ﴾الذاريـات، أَي: عَذَابَكُـمْ، وَتَـارَةً فِي الإخْتِبـارِ: ﴿ وَفَتَنَّاكَ فُتُونًا ﴿٤٠﴾ ﴾ طـه، وَجُعِلَـتِ الفِتْنَـة كالبَـلاَءِ فِي أَنَّهَـا يُسـتعْمَلاَنِ فِيْـمَا يُدْفَـعُ إِلَيْـهِ الإنْسـانُ، مِـنْ شِـدَّةٌ وَرَخَـاءٍ وَهُـمَا فِي الشـدَّةِ أَظْهَـرُ مَعْنَـىً وَأَكْثَـرُ اسـتعْمَالاً).**

وشەی (فَتْن) لە ڕیشەدا بریتیە لەوە کە زێڕ بخرێتە نێو ئاگرەوە و، تاکو دەرکەوێ کە چەندەی ساغەو، چەندەشی خراپە ؟! (واتە: کانزای دیکەی ڕەگەڵ خراوە)، هەروەها وشەی (فَتْن) بەکارهێنراوە بۆ ئەوەش کە مرۆڤ بە ئاگر سزا بدرێ، ﴿ ذُوقُواْ فِتْنَتَكُمْ ﴿١٤﴾ ﴾ الذاریات، واتە: سزایەکەتان بچێژن، سزای چونە نێو ئاگر، دیسان بۆ تاقیکردنەوەش بەکاردێ، وەك لە سوورەتی (طـه)دا خوا ﷻ بە مووسا دەفەرموێ: ﴿ وَفَتَنَّٰكَ فُتُونًا ﴿٤٠﴾ ﴾ واتە: تۆمان تاقیکردەوە بە زۆر تاقیکردنەوون، یانی: زۆر بەڵاو گرفتارییمان بەسەرت هێنان.

ئنجا وشەی (فِتْنة) لەگەڵ (بَلاَء) وەك یەك بەکاردەهێنرێن، لەوەدا کە مرۆڤ دەخرێتە نێو سەختیی، یاخود خۆشییەوە.

بەڵام هەم (فِتْنة) و، هەم (بَلاَء) لە سەختیی و نارەحەتییاندا زیاتر بەکاردەهێنرێن، تاکو لە خۆشیی و ئەو شتانەی مرۆڤ پێی هات بێ و پێی خۆش بێ.

( تُجَٰدِلُ ): واتە: مشتومڕ دەکات، شەڕە قسە دەکات، (**أَصْلُ الجِدَالِ مِنْ: جَدَلْتُ الحَبْلَ، أَي: أَحْكَمْتُ فَتْلَهُ ،... وَمِنْهُ الجِدَالُ فَكأَنَّ المُتَجَادِلَيْنِ يَفْتِلُ كُلُّ وَاحِدٍ الآخَر عَنْ رَأْيِهِ...، وَقِيْلَ: الأَصْلُ فِي الجِدَالِ: الصِّرَاعُ وَإِسْقَاطُ الإِنْسَانِ صَاحِبَهُ عَلَى الجَدَالَةِ، وَهِيَ الأَرْضُ الصُلْبَة**).

واتە: وشەی (جِدَال) لە ڕیشەوە لەوەوە هاتوە: (**جَدَلْتُ الحَبْلَ، أَي: أَحْكَمْتُ فَتْلَهُ**) واتە: پەتەکەم باش چنیی، باشم هۆنیەوە، {(فَتْل) واتە: هۆنینەوەی شتێك، یان چنین و ڕستنی، (جِدَال)یش لەوەوە هاتوە} یانی: ئەو دوو کەسە کە پێکەوە شەڕە قسە دەکەن، هەرکامێکیان بیەوێ ئەوی دیکە بسووڕێنێتەوە بۆ ڕای خۆی، وەك چۆن چەند داوەبەنێك تێك دەسووڕێن و تێك باهەڵدەدرێن، ئەویش بیەوێ تێکی باهەڵدا و[1] بیهێنێتە سەر ڕای خۆی.

هەندێکیش گوتوویانە: وشەی (جِدَال) ڕیشەکەی بریتیە لە ناکۆکیی کردن و، ئەوە کە مرۆڤ هەوڵبدات بەرانبەرەکەی بخاتە سەر (جَدَالة)، (جَدَالة)ش بریتیە لە زەوییەکی سەخت و پتەو.

( وَتُوَفَّىٰ ): واتە: بە تەواویی وەردەگرێ و دەیدرێتێ، {**الوَافِي: الَّذِي بَلَغَ التَّمَام، وَتَوْفِيَة الشيءِ: بَذْلُهُ وَافِياً وَاستِيْفَاؤُهُ: تَناوُلُهُ وَافِياً:** ﴿ وَوُفِّيَتْ كُلُّ نَفْسٍ مَّا كَسَبَتْ بَيْنَهُمْ .. ﴿٢٥﴾ ﴾ آل عمران}، وشەی (وَافِي) ئەوەیە کە گەیبێتە ڕاددەی تەواو بوون، (**تَوْفِيَة الشيء: بَذْلُهُ وَافِياً**)، وشەی (تَوْفِيَة) بەوە دەگوترێ، کە شتێك بەتەواویی بدرێ، بەڵام (**إِستِيفَاء**)

---

(١) تێك با هەڵدان: پێکەوە پەیوەست کردن و گرێدان بەهۆی سووڕاندنەوە.

ئەوەیە بە تەواویی وەربگیرێ، دەگوترێ: (إستفَى حَقَّه، استیفاء)، واتە: بە تەواویی وەریگرت، بەڵام (أوْفَاهُ حَقَّهُ) واتە: بە تەواوی هەقەکەی پێدا، خوا دەفەرموێ: ﴿وَمَنْ أَوْفَىٰ بِعَهْدِهِۦ مِنَ ٱللَّهِ...﴿١١١﴾﴾التوبة، واتە: کێ لە خوا چاکتر پەیمانی خۆی بە تەواویی دەباتە سەرێ.

هەروەها لە سوورەتی (النجم)دا دەفەرموێ: ﴿وَإِبْرَٰهِيمَ ٱلَّذِى وَفَّىٰٓ ﴿٣٧﴾﴾، واتە: ئەو ئیبراهیمەی کە بە تەواویی ئەرکی خۆی جێبەجێ کرد.

لە سوورەتی (آل عمران)یش دا دەفەرموێ: ﴿وَوُفِّيَتْ كُلُّ نَفْسٍ مَّا كَسَبَتْ... ﴿٢٥﴾﴾، واتە: واتە: هەر کەسە بە تەواویی ئەوەی کە کرد بووی وەریگرت، واتە: بەرهەمەکەی وەرگرتەوە، ئنجا سزایە یان پاداشت.

کەواتە: هەم (أَوْفَىٰ) هەم (وَفَّىٰ) هەردووکیان بە مانای بە تەواویی جێبەجێکردنی ئەرکێکن، ئەگەر پەیمانە، ئەگەر بەڵێنە، ئەگەر هەر ئەرکێکی شەرعییە.

## هۆی هاتنە خوارەوەی ئەم ئایەتە

﴿ مَن كَفَرَ بِٱللَّهِ مِنۢ بَعۡدِ إِيمَٰنِهِۦٓ إِلَّا مَنۡ أُكۡرِهَ وَقَلۡبُهُۥ مُطۡمَئِنُّۢ بِٱلۡإِيمَٰنِ وَلَٰكِن مَّن شَرَحَ بِٱلۡكُفۡرِ صَدۡرٗا فَعَلَيۡهِمۡ غَضَبٞ مِّنَ ٱللَّهِ وَلَهُمۡ عَذَابٌ عَظِيمٞ ﴿١٠٦﴾ ﴾:

لەبارەی ئەم ئایەتەوە، ئەم گێڕراوەیە هەیە:

{عَنْ أَبِي عُبَيْدَةَ بْنِ مُحَمَّدِ بْنِ عَمَّارِ بْنِ يَاسِرٍ فِي قَوْلِهِ تَعَالَى: ﴿ مَن كَفَرَ بِٱللَّهِ مِنۢ بَعۡدِ إِيمَٰنِهِۦٓ إِلَّا مَنۡ أُكۡرِهَ وَقَلۡبُهُۥ مُطۡمَئِنُّۢ بِٱلۡإِيمَٰنِ وَهَٰذَا .. ﴿١٠٦﴾ ﴾، **قَالَ: أَخَذَ الْمُشْرِكُونَ عَمَّارَ بْنَ يَاسِرٍ يُعَذِّبُوهُ فَقَارَبُوهُ فِي بَعْضِ مَا أَرَادُوا بِهِ، فَشَكَا ذَلِكَ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: كَيْفَ تَجِدُ قَلْبَكَ؟ قَالَ ﷺ: مُطْمَئِناً بِالإِيمَانِ، قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: فَإِنْ عَادُوا فَعُدْ**}[1].

واتە: ئەبوو عوبەیدەی کوڕی موحەممەدی کوڕی عەمماری کوڕی یاسر، (واتە: نەوەی عەمماری کوڕی یاسر)، دەربارەی قسەی خوای بەرز کە دەفەرموێ: ﴿ إِلَّا مَنۡ أُكۡرِهَ وَقَلۡبُهُۥ مُطۡمَئِنُّۢ بِٱلۡإِيمَٰنِ ﴾، واتە: مەگەر کەسێك زۆری لێکرا بێ و، دڵیشی بە ئیمان ئارامگرتوو بێ، ئەوە خوا ﷻ لێی ناگرێ و، سزای نادات، لەوبارەوە گوتوویەتی: ئەو بەسەرهاتە هەیە.

هاوبەش بۆ خوا دانەرەکان عەمماری کوڕی یاسریان گرت، (لە مەککە)، ئەشکەنجەیان دا، زۆر ناڕەحەتیان کرد، هەتا هەندێك لەو شتانەی کە دەیانویست بۆی کردن، بۆی گوتن، (هەندێ قسە بە دڵی ئەوان)، دوای ئەوە سکاڵای بردە لای پێغەمبەری خوا ﷺ، پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: دڵت چۆنە؟ (واتە: ئەو کاتەی کە ئەو قسانەت کردن، دڵت چۆن بوو؟) گوتی: دڵم ئارامگرتوویە بە ئیمان، دڵم پڕە لە ئیمان، {بەڵام بە ناچاریی ئەو قسانەم کرد، هەتا ئەوان دڵیان پێ خۆش بێ و لە کوڵ خۆمیان بکەمەوە، دیارە ئازارو ئەشکەنجەکەی زۆر بووە و، بۆی تەحەممول نەکراوە}[2] پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: (**فَإِنْ عَادُوا فَعُدْ**)، ئەگەر ئەوان گەڕانەوە (بۆ ئەشکەنجەدانی تۆ، بۆ ئازاردانی تۆ)، تۆش

---

(١) أَخْرَجَهُ عَبْدُالرَّزَّاق فِي تَفْسِيرِه: ج١، ص٣٦٠، وَإِبْنُ سَعْدٍ فِي الطبقات الكبرى ج ٣، ص ٢٤٩، وَالطَّبَرِي فِي جامع البيان: ج ١٤، ص ١٢٢، وَأَخْرَجَهُ أَيْضاً الحَاكِمُ: ٣٣٦٢، وَقَالَ: هَذَا حَدِيثٌ صَحِيحٌ عَلَى شَرْطِ الشَّيْخَيْنِ، وَلَمْ يُخْرِجَاهُ، وَوَافَقَهُ الذَّهَبِي، قَالَ مُؤَلِّفا الإِسْتِيعَاب فِي بيان الأسباب: ج ٢، ص ٤٢٣، سَنَدُهُ ضَعِيفٌ.

(٢) نێوان کەوانەکان زیادەی خۆمە، بۆ ڕوونبوونەوەی مەبەست.

بگەڕێوە (بۆ ئەو قسانە، بۆ ئەوەی دڵی ئەوانی پێ لە خۆت ڕازی بکەی و، لە کۆڵ خۆتیان بکەیەوە)، کە دوایی بە تەفصیل لەوبارەوە قسە دەکەین.

ئەم دەقە لە ڕووی سەنەدەوە، زانایان ڕاجیاییان لەسەری هەیە، هەرچی (**عبدالرزاق**)ە، لە تەفسیرەکەی خۆیدا هێناویەتی و، (**إِبْنُ سَعْد فِي الطبقات**)دا و، (**الطَّبري فِي جامع البيان**)دا، وایان هێناوە، کە بەڕاستیان داناوە، هەروەها (**الحاكم**) گوتوویەتی: کە ئەمە فەرموودەیەکە بەپێی مەرجەکانی بوخاریی و موسلیم ڕاستە، هەرچەندە نەشیانهێناوە و، (**الذهبي**)یش گوتوویەتی: (**الحاكم**) پێکاویەتی لەو حوکمەدا، بەڵام هەردوو نووسەری کتێبی: (**الإستيعاب فِي بيان الأسباب**) سەنەدەکەیان بە بێهێز داناوە.

هەڵبەتە لەوانەیە زانایەکی دیکەش بڵێ: نەخێر ئێوە نەتانپێکاوە، ئیدی گرنگ ئەوەیە لەڕووی سەنەدەوە، ئەو دەقە، مشتومڕی لەسەرە، بەڵام لە ڕووی واقیعییەوە، دیارە کە عەممارى کوڕی یاسر لە قۆناغی مەککەدا ئەویش و ژمارەیەك لە هاوەڵان، کە زەقترینیان: (**بيلال**)ە، هەڵبەتە (أبو بەکر)یش ئەزیەت دراوە و (**عبدالرحمن بن عوف**)یش ئەزیەت دراوە و، زۆر لە هاوەڵان ئەزیەت دراون، بەڵام ئەوەی عەممار زۆر ئاشکرایە، کە بە سەختیی سزاو ئازار و ئەشکەنجە دراوە، لەلایەن کافرەکانەوە.

## مانای گشتی ئایەتەکان

خـوا ﷻ لـە سـیاقی: بـاسی دژایەتیـی کافـرەکان بـۆ قورئـان و، تۆمـەت هەڵبەسـتنیان بـۆ پێغەمبـەری خاتـەم ﷺ و، بـۆ قورئـان کـە کەسـێکی دیکـە قورئـانی فێـر کـردووە، بـۆ پێغەمبـەر کـە قسـەی بـە نـاوی خـواوە هەڵبەسـتوە، لـەو سـیاقەدا، کـە دیـارە ئـەو ناکۆکیـی و دووبەرەکێیە ببـێ لـە نێـوان کافـران و ئیمانـداران دا و، کافرەکانیـش کـە باڵادەسـتن و حوکمڕانـن و، دیـارە ئیماندارانێـك کـە بـێ دەسـتەڵاتن و کەمینـەن، کـەم و زۆر دەکەونـە بـەر زەخـت و فشـاریان و، ئازاریـان دەدەن و ئەشـکەنجەیان دەدەن، لـە ئەنجامـی ئـەوەش دا حاڵـەتی هەڵگەڕانـەوە (إرتـداد) دروسـت دەبـێ، ئنجـا چ هەڵگەڕانەوەیـەکی ڕاسـتەقینە، چ هەڵگەڕانەوەیـەکی ڕووکەشیی، کـە کابـرا بـە قسـە هەنـدێ شـت بڵـێ، بـەڵام لـە دڵیـدا وانەبـێ، بـۆ ڕازییکـردنی ئـەو کەسـانەی کـە ئەشـکەنجەی دەدەن، بـۆ ئـەوەی لـە کـۆڵ خۆییـان بکاتـەوە، هـەم ئـەوە دێتـە پێـش، هـەم مەسـەلەی کۆچکـردن دێتـە پێـش، بەجێهێشـتنی مـاڵ و حـاڵ و نیشـتیمان، ئنجـا خـوا ﷻ لـەم شـەش ئایەتـەدا، باسـی ئـەو دوو مەسـەلەیە دەکات:

سـەرەتا دەفەرمـوێ: ﴿ مَن كَفَرَ بِٱللَّهِ مِنۢ بَعۡدِ إِيمَٰنِهِۦٓ إِلَّا مَنۡ أُكۡرِهَ وَقَلۡبُهُۥ مُطۡمَئِنُّۢ بِٱلۡإِيمَٰنِ ﴾، هـەر کەسـێك بێبـڕوا بـێ بـە خـوا، دوای ئیـمان هێنـانی {واتـە: دوای ئیـمان هێنـانی، بێبڕوابێتـەوە} مەگـەر کەسـێك زۆری لـێ بکـرێ و، دڵیـشی ئارامگرتـوو بـێ بـە ئیـمان، {واتـە: دڵی پـڕ بـێ لـە ئیـمان و، دڵـی نەلەخشـێ و نەلـەرزێ، بـەڵام بـە قسـە هەنـدێ شـت بڵـێ، یـان بـە کـردەوە هەنـدێ شـت بـکات، پێچەوانـەی ئـەو ئیمانـە بـێ: کـە لـە دڵـی دایـە، لەبەرئـەوەی کـە زۆری لـێ دەکـرێ و ناچـار دەکـرێ} ئنجـا خـوا ﷻ بـاسی نەکـردوە: ئـەو حاڵەتـە چۆنـە؟ بـەڵام کـە دوایـی دەفەرمـوێ: ﴿ وَلَٰكِن مَّن شَرَحَ بِٱلۡكُفۡرِ صَدۡرٗا فَعَلَيۡهِمۡ غَضَبٞ مِّنَ ٱللَّهِ وَلَهُمۡ عَذَابٌ عَظِيمٞ ﴾، بـەڵام کەسـێك سـینەی گوشـادو ئاوەڵابـێ بـۆ کوفـر، ئەوانـە تووڕەیـی خوایـان لەسـەرەو، سـزایەکی مەزنیـان هەیـە.

کەواتـە: کەسـێك کـە ناچـار دەکـرێ و دڵیـشی پـڕە لـە ئیـمان و، دڵ و سـینەی خـۆی ئـاوەڵا نـاکات بـۆ کوفـر، ئـا ئەوانـە: نـە تووڕەیـی خوایـان لەسـەرەو، نـە سزاشـیان بـۆ هەیـە، بـەڵام بۆیـە خـوا ﷻ بـاسی نەکـردوە، چونکـە: بـە سـیاق و سـەلیقە دیـارە، کـە ئەگـەر کەسـێك بـە دڵخۆشـیی و بـە ویسـتی خـۆی و، بـە دڵ بـۆ کردنـەوەوە، پێشـوازیی لـە کوفـر بـکات، شایسـتەی ئـەوە بـێ، خـوا لێـی تووڕەبـێ و سـزایەکی مەزنیـشی هەبـێ، بێگومـان کەسـێك ناچار

بکرێ، دیارە حوکمەکەی پێچەوانەیە و، خوا، نە لێی توورە دەبێ و نە سزاشی دەدات، چونکە ناچار کراوە، کەواتە: مۆڵەتیشە کە کەسێك ناچار بکرێ لەسەر کوفر، هەندێ شت بڵێ و هەندێ شت بکات، بۆ ئەوەی ئەوانەی کە ناچاری دەکەن، لە کۆڵ خۆییان بکاتەوەو، ئەو ئازارو نارەحەتییەی کە دەیدەن، لە خۆی دووری بخاتەوە، وەك دوایی لە باسێکی سەربەخۆدا بە تەفصیل باسی ئەوە دەکەین.

دوایی خوا ﷻ هۆکاری ئەوە کە لێیان توورەیەو، سزای مەزنیشیان هەیە لە دوارۆژدا، هۆکارەکەی دەخاتە ڕوو، دەفەرموێ: ﴿ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمُ ٱسْتَحَبُّوا۟ ٱلْحَيَوٰةَ ٱلدُّنْيَا عَلَى ٱلْـَٔاخِرَةِ ﴾، ئەویش بەهۆی ئەوەوە کە ژیانی دنیایان خۆشترویستوەو هەڵبژاردوە بەسەر ژیانی دوارۆژدا، ﴿ وَأَنَّ ٱللَّهَ لَا يَهْدِى ٱلْقَوْمَ ٱلْكَـٰفِرِينَ ﴾، هەروەها بەهۆی ئەوەشەوە: کە خوا کۆمەڵی کافران، ناخاتە سەر ڕاستە ڕێ، ئەوانەش ڕێی ڕاستیان نەگرتۆتەبەرو، بە ڕێی لاردا هاتوون و، بە کۆڵێك گوناهو تاوانەوە هاتوونەوە خزمەت خوا ﷻ، بۆیە خوا ﷻ لێیان توورەیە و، بۆیەش سزای مەزنیان بۆ هەیە.

﴿ أُو۟لَـٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ طَبَعَ ٱللَّهُ عَلَىٰ قُلُوبِهِمْ وَسَمْعِهِمْ وَأَبْصَـٰرِهِمْ ﴾، ئا ئەوانە کەسانێکن کە خوا مۆری بەسەر دڵەکانیانەوە ناوەو، مۆری بەسەر بیستنیانەوە ناوەو، مۆری بەسەر چاوەکانیشیانەوە ناوە، واتە: نە دڵەکانیان وەك پێویست تێدەگەن، نە هەستی بیستنیان، وەك پێویست کاردەکات، کە هەق ببیستێ و، نە چاوەکانیشیان وەك پێویست کاردەکەن کە هەق ببینن، ﴿ وَأُو۟لَـٰٓئِكَ هُمُ ٱلْغَـٰفِلُونَ ﴾، ئا ئەوانە بێئاگایانن، ئەگەر بێئاگا نەبوونایە لە هەق، ئامادە نەدەبوون، وا بە ئاسانیی دەستبەرداری ئەو هەقە بن، بە تۆزە ترسێك و تۆزە برسێك.

﴿ لَا جَرَمَ أَنَّهُمْ فِى ٱلْـَٔاخِرَةِ هُمُ ٱلْخَـٰسِرُونَ ﴾،بە دڵنیاییەوە ئەوانە لە دوارۆژدا، هەر ئەوانن زیانبار، زیانبارانی ڕاستەقینە هەر ئەوانەن، کە ڕێیان لە هەق هەڵدەکەوێ، خوا ڕێی ڕاستیان بۆ ڕۆشن دەکاتەوە، تێیدەگەن و لێی شارەزا دەبن، کەچی دواتر دەستبەرداری دەبن، لە ژێر زەخت و فشاری ئەهلی کوفردا.

ئنجا دێتە سەر باسی بابەتی دووەم، کە بریتیە لە کۆچکردن و، بەجێهێشتنی ماڵ و حاڵ و نیشتیمان لە ژێر زەخت و فشاری ئەهلی کوفردا، دەفەرموێ: ﴿ ثُمَّ إِنَّ رَبَّكَ لِلَّذِينَ هَاجَرُوا۟ مِنۢ بَعْدِ مَا فُتِنُوا۟ ثُمَّ جَـٰهَدُوا۟ وَصَبَرُوٓا۟ إِنَّ رَبَّكَ مِنۢ بَعْدِهَا لَغَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴾، پاشان بێگومان پەروەردگارت بۆ کەسانێك کە کۆچیان کردوە، دوای ئەوەی کە ئەشکەنجە دراون، بەڵام دوایی تێکۆشاون و خۆڕاگربوو ون، {واتە:

خۆڕاگر بوون لەسەر کۆچکردن، لەسەر تێکۆشان، لەسەر خەبات کردن} بە دڵنیاییەوە پەروەردگارت لە دوای ئەوە، {واتە: لە دوای ئەشکەنجەدرانیان و، لە دوای کۆچکردنیان و تێکۆشان و خۆڕاگرییان} پەروەردگارت لێبوردەی بە بەزەییە.

لە کۆتاییی دا خودا باسی سەرەنجامی هەموو لایەك دەکات، چ چاکەکاران، چ خراپەکاران، چ ئەوانەی خۆڕاگربوون، چ ئەوانەی خۆڕانەگر بوون، چ ئەوانەی کاریان بە عەزیمەت کردوە و، قسەیەکی وایان نەکردوە کە ئەهلی کوفر دڵیان پێی خۆشبێ، چ ئەوانەی کاریان بە مۆڵەت کردوەو، چ ئەوانەی کە لە مۆڵەتیش بەولاوەتر چوون و، سینەی خۆیان کردۆتەوە و، دەروازەی دڵی خۆیان کردۆتەوە، بۆ کوفر و بێ دینیی، لەبەر زەخت و فشارێك کە لێیان کراوە، لە ترسان، لە برسان، بە هەر هۆکارێك، ئا ئەوانە، خوای دادگەرو کارزان بە یەك ئایەت باسی هەموویان دەکات.

﴿ يَوۡمَ تَأۡتِي كُلُّ نَفۡسٖ تُجَٰدِلُ عَن نَّفۡسِهَا ﴾ ڕۆژێك کە هەموو کەس دێ، بەرگریی لە خۆی دەکات بە شەڕە قسەو مشتومڕ، بەرگریی لە خۆی دەکات، ﴿ وَتُوَفَّىٰ كُلُّ نَفۡسٖ مَّا عَمِلَتۡ ﴾ هەموو کەسێکیش بەپێی ئەوەی کە کردوویەتی و ئەنجامی داوە، پاداشت و سزای پڕ بە پێست و تەواوی دەدرێتەوە ﴿ وَهُمۡ لَا يُظۡلَمُونَ ﴾ لە حاڵێك دا کە ستەمیشیان لێناکرێ.

ئنجا ئەگەر چاکەکار بووبن، پاداشتیان دەدرێتەوەو، ئەگەر خراپەکار بووبن، سزایان دەدرێتەوە، بەڵام هیچ کامیان ستەمیان لێ ناکرێ، هەڵبەتە خوا ﷻ لەگەڵ ئەهلی ئیماندا، وێڕای عەدل بە فەزڵیش مامەڵە دەکات، واتە: زیاد لە شایستەیی خۆیان، مافیان پێدەدات و پاداشتیان دەداتەوە، بەڵام لەگەڵ ئەهلی کوفردا، هەر بە دادگەریی مامەڵە دەکات و، زیاتر لەوەی کە شایستەی نین، زیاتر لەو سزایەی کە پڕ بە پێستی کردەوەکەی خۆیانە، سزایان نادات، بەڵکو بە دادگەریی لەگەڵیاندا مامەڵە دەکات، هەڵبەتە خوا ﷻ لە هەندێ شوێندا، باسی ئیماندارانیش دەکات: ﴿ لِيَجۡزِيَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ بِٱلۡقِسۡطِۚ .. ﴿٤﴾ ﴾ یونس، بەڵام لەوێدا مەبەست ئەوەیە کە: سەرەتا خوا بەپێی تەرازووی دادگەرانەی دەفەرموێ: ئەوە پاداشتەکەتانە، بەڵام دواییش لە شوێنێکی دیکەدا، دەفەرموێ: ﴿ لِيَجۡزِيَهُمُ ٱللَّهُ أَحۡسَنَ مَا عَمِلُواْ وَيَزِيدَهُم مِّن فَضۡلِهِۦۗ وَٱللَّهُ يَرۡزُقُ مَن يَشَآءُ بِغَيۡرِ حِسَابٖ ﴿٣٨﴾ ﴾ النور، وەك بەخششی خۆی بۆیان زیاد دەکات، پێشێ مافی ڕەوای خۆیان بە تەواویی بە پێی دادگەریی، دەدرێتێ و دواییش وەك بەخشش (فَضل) پاداشتی دیکەشیان دەدرێتەوە، واتە: ئەوە کە دەفەرموێ: ﴿ لِيَجۡزِيَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ بِٱلۡقِسۡطِۚ ... ﴿٤﴾ ﴾ یونس، ڕێگر نیە لەوە کە: خوا جگە لەوەی بە دادگەریی و پڕ بە پێستی کردەوەکانی خۆیان دەیانکەوێ، زیادەشیان بۆ بخاتە سەر.

## مەسەلە گرنگەکان

**مەسەلەی یەکەم:**

**هەر کەسێك پاش بڕواهێنانی بە خوا، بێبڕوا بێتەوە، - مەگەر ناچار بکرێ لەسەر کوفر - ئەوە خوا لێی تووڕە دەبێ و، ئەو کەسە سزایەکی مەزنی دەبێ، چونکە ژیانی دنیای بەسەر هی دواڕۆژدا هەڵبژاردوە و خۆشتری ویستوەو، ئەوانە خوا دڵ و گوێ و چاویانی مۆر کردوە و، ئەوانە بێئاگان و، بە دڵیایی لە دواڕۆژدا، هەر ئەوانە زیانباری ڕاستەقینەن:**

خوا دەفەرموێ: ﴿ مَن كَفَرَ بِٱللَّهِ مِنۢ بَعۡدِ إِيمَٰنِهِۦٓ إِلَّا مَنۡ أُكۡرِهَ وَقَلۡبُهُۥ مُطۡمَئِنُّۢ بِٱلۡإِيمَٰنِ وَلَٰكِن مَّن شَرَحَ بِٱلۡكُفۡرِ صَدۡرٗا فَعَلَيۡهِمۡ غَضَبٞ مِّنَ ٱللَّهِ وَلَهُمۡ عَذَابٌ عَظِيمٞ ﴿١٠٦﴾ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمُ ٱسۡتَحَبُّواْ ٱلۡحَيَوٰةَ ٱلدُّنۡيَا عَلَى ٱلۡأٓخِرَةِ وَأَنَّ ٱللَّهَ لَا يَهۡدِي ٱلۡقَوۡمَ ٱلۡكَٰفِرِينَ ﴿١٠٧﴾ أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ طَبَعَ ٱللَّهُ عَلَىٰ قُلُوبِهِمۡ وَسَمۡعِهِمۡ وَأَبۡصَٰرِهِمۡۖ وَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡغَٰفِلُونَ ﴿١٠٨﴾ لَا جَرَمَ أَنَّهُمۡ فِي ٱلۡأٓخِرَةِ هُمُ ٱلۡخَٰسِرُونَ ﴿١٠٩﴾ ﴾.

### شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە دە بڕگەدا:

١- ﴿ مَن كَفَرَ بِٱللَّهِ مِنۢ بَعۡدِ إِيمَٰنِهِۦٓ ﴾، واتە: هەر کەسێك لە دوای بڕواهێنانی، بێبڕوابێ بە خوا.

(مِنۢ بَعۡدِ إِيمَٰنِهِۦٓ)، (**أي: بَعْدَ تَمَكُّنِ الإيمانِ فِي قَلْبِهِ**)، دوای ئەوەی ئیمان لە دڵیدا جێگیر بووە و، بڕوای هێناوە، بێبڕوابێتەوە و، کوفر بە خوا بکات، دوایی وەڵامەکەی دێ، بەڵام وەك قسەیەکی نێواخن و، وەك (**الجُمْلَةُ المُعْتَرِضَة**)، کە ڕستەیەکە دەخرێتە نێوان ڕستەکانی دیکەوە، دەفەرموێ:

٢- ﴿ إِلَّا مَنۡ أُكۡرِهَ وَقَلۡبُهُۥ مُطۡمَئِنُّۢ بِٱلۡإِيمَٰنِ ﴾ واتە: مەگەر کەسێك بێبڕوابێ بە خوا، بە ڕواڵەت و بە قسە، بەڵام لەبەرئەوەی ناچارکراوە و، زۆری لێکراوە و، دڵیشی بە ئیمان ئارامگرتوو

بێ، واتە: دڵی دامەزراو و، نەلەخشاو بێ، ئەو کەسە لەو حوکمەی کە دوایی خوا باسی دەکات، هەڵاوێردراوە و، جیاکراوەتەوە، واتە: ئەو کەسە مۆڵەتی بۆ هەیە و بەو مۆڵەتە کاری کردوە، بۆیە: نە تووڕەیی خوای دێتە سەرو، نە ئازاری مەزنیشی دەبێ لە دوا ڕۆژدا.

٣- ﴿ وَلَٰكِن مَّن شَرَحَ بِٱلۡكُفۡرِ صَدۡرٗا ﴾، بەڵام کەسێك سینەی گوشاد بێ بۆ کوفر، دڵی خۆی بۆ کوفر بکاتەوە، دەڵێ: (**شَرَحَ بالْكُفْرِ صَدْراً: وَسَّعَهُ لِقُبُولِ الكُفْرِ**)، دڵی خۆی فراوان بکات، بۆ ئەوەی کوفری بچێتێ، دەروازەی دڵی خۆی بۆ کوفر بکاتەوە، یانی: بە دڵکراوەیی و باخەڵ فەڕاحیی و سینگ فراوانیی، (**بِرَحابة الصدر**) بە دڵ پێخۆشبوونەوە، نەك بە ناچاریی.

٤- ﴿ فَعَلَيۡهِمۡ غَضَبٞ مِّنَ ٱللَّهِ ﴾ کەسانێك سینە و دڵی خۆیان بۆ کوفر بکەنەوە، تووڕەیی خوایان دێتە سەر، دەڵێ: (**الجُمْلَةُ الإِسْمِية تَدُلُّ عَلَى الدَّوام والثُّبُوت**)، کە دەفەرموێ: (فَعَلَيۡهِمۡ غَضَبٞ مِّنَ ٱللَّهِ)، تووڕەیی خوایان لەسەرە، ڕستەی ناویی، بەردەوام بوون و چەسپاویی دەگەیەنێ.

٥- ﴿ وَلَهُمۡ عَذَابٌ عَظِيمٞ ﴾، واتە: هەروەها بۆ ئەوان سزایەکی مەزن هەیە، (**لَهُمْ**)، (**الجار والمجرور**)ە، دەڵێ: {**تَقْدِيمُ (لَهُمْ) عَلَى (عَذَابٍ عَظِيم) للإِهْتِمام**}، هەمیشە کە (**الجار والمجرور**) پێش دەکەون، ئەوە بۆ گرنگیی پێدانە، واتە: سزایەکی مەزن بۆ ئەوان هەیە، بۆچی؟ دوایی هۆکارەکەی ڕوونکراوەتەوە:

٦- ﴿ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمُ ٱسۡتَحَبُّواْ ٱلۡحَيَوٰةَ ٱلدُّنۡيَا عَلَى ٱلۡأٓخِرَةِ ﴾، واتە: ئەوەش بەهۆی ئەوەوە کە ئەوانە ژیانی دنیایان خۆشتر ویستوە و {هەڵیانبژاردوە} بەسەر دواڕۆژدا، پێشتر باسمان کرد کە: (ٱسۡتَحَبُّواْ)، هەر (**أَحَبُّوا**)یە، بەڵام (س و ت) خراونە سەر، بۆ زێدەڕۆیی تێداکران و تۆخکردنەوەی مانایەکەی، (ٱسۡتَحَبُّواْ)، واتە: زۆریان خۆشویستوە، چونکە کردار ئەگەر پیتەکانی زیاتر بن، مانایەکەشی بەهێزترە: (**زِيادَةُ المَبْنى تَدُلُّ عَلَى زِيادَةِ المَعْنى**)، کردار (**فعل**) ئەگەر پیتەکانی زیاتر بن، ماناکەشی بەهێزتر دەبێ، وەك (**تَأَخَّرَ**) و (**استأْخَرَ**)، (**تَقَدَّمَ**) و (**استقْدَمَ**)، دووەمەکان مانایەکەیان بەهێزتر دەبێ، لە یەکەمەکان.

کە دەفەرموێ: (ٱسۡتَحَبُّواْ ٱلۡحَيَوٰةَ ٱلدُّنۡيَا **عَلَى** ٱلۡأٓخِرَةِ)، (ٱسۡتَحَبُّواْ ٱلۡحَيَوٰةَ ٱلدُّنۡيَا)، یانی: (**أَحَبُّوا الحَياةَ الدُّنْيا**)، واتە: ژیانی دنیایان خۆشویستوە، یان زۆریان خۆشویستوە، ئنجا (ٱسۡتَحَبُّواْ) پێویستی بەوە ناکات، بە پیتێك بەرکار بخوازێ، بەڵام کە دەفەرموێ: (ٱسۡتَحَبُّواْ ٱلۡحَيَوٰةَ ٱلدُّنۡيَا عَلَى ٱلۡأٓخِرَةِ)، بەم (**على**)یە، تێپەڕی پێکراوە بۆ (**الآخرة**)،

چونکـە: (ضُمِّـن مَعْنـى فَضَّلُوا وآثَـرُوا)، یانـی: هەڵیانبـژاردوە و، بـە باشـتریان دانـاوە، خراوەتـە نێـو: (أَسْتَحَبُّواْ)ەوە، بەهـۆی ئـەو پیتـی (عـلى)ەوە، چونکـە بنچینەیـەکی زمـانی عەرە.بییـە هـەر کـردار (فعـل) پێویسـتیی بـە پیـت (حرف)ێـك نەبـێ بـۆ بـەرکار خواسـتن و، بـەرکار (مفعـول)ی پـێ بخـوازێ، ئـەوە وێـڕای مانایەکـەی خـۆی، مانایـەکی دیکـەش بـە پێـی مانـای پیتەکـە دەگرێتـە خـۆی، ئەمـەش پێـی دەگوتـرێ: بنەمـای وەگـەڵ خسـتن (قاعـدة التضمـين ).

٧- ﴿ وَأَنَّ ٱللَّهَ لَا يَهۡدِي ٱلۡقَوۡمَ ٱلۡكَٰفِرِينَ ﴾، هەروەها بەهۆی ئەوەشەوە، کە خوا کۆمەڵی کافران ڕاستەڕێ ناکات، ئەمە هۆکاری دووەمی تووڕەیی خوا و، سزای مەزنی خوایە، واتە: بەهۆی ئەوەوە کە خوا لە خستنە سەر ڕێ و، لە ڕاستەڕێ کردنی خۆی، بێبەشی کردوون، ئنجا ئەوانە کە لە هیدایەتی تایبەتی خوا بێبەش بوون، دیارە کەسێك کە لە هیدایەتی خوا بێبەش بێ، خوا لێی تووڕە دەبێ، بەڵام بێبەش بوون، لەبەرئەوەی خۆیان نەیانویستوە، وەك خوا عزّ وجلّ دەفەرمویْ: ﴿ وَأَمَّا ثَمُودُ فَهَدَيۡنَٰهُمۡ فَٱسۡتَحَبُّواْ ٱلۡعَمَىٰ عَلَى ٱلۡهُدَىٰ ﴿١٧﴾ ﴾ فصلت، واتە: گەلی (ثمود)مان ڕێنمایی کرد، بەڵام ئەوان کوێرییان هەڵبژارد و، خۆشتر ویست، بەسەر ڕێنمایی و ڕێ دیتن دا.

٨- ﴿ أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ طَبَعَ ٱللَّهُ عَلَىٰ قُلُوبِهِمۡ وَسَمۡعِهِمۡ وَأَبۡصَٰرِهِمۡ ﴾، واتە: ئا ئەوانە کەسانێکن، کە خوا مۆری بەسەر دڵیانەوەو، بەسەر بیستنیانەوە و، بەسەر چاوەکانیانەوە، ناوە.

(الطَبْـعُ مُسـتعارٌ لِمَنْـعِ وصُـولِ الإيمَـانِ)، وەك پێشـتریش لـە شـیکردنەوەی مانـای (طَبْـع) و، (خَتْـم)دا باسـمان کـرد، (طَبْـع)، خوازراوەتـەوە بـۆ ئـەوە: کـە خـوا ڕێـی لـێ گرتـوون، کـە ئیـمان بچێتـە نێـو دڵیـان، هەڵبەتـە خـوا ڕێـی لـێ نەگرتـوون، بـەو واتایـە کـە ڕاسـتەوخۆ خـوا ڕێیـان لـێ بگـرێ، بـەڵام یـانی: بـە پێـی یاسـای خـوا، هـەر کەسـێك لەسـەر ئـەو گوناهانـە بـەردەوام بـێ، دڵـی دادەخـرێ، لـە بەرانبـەر هیدایەتـی خـوادا، ئنجـا لەبەرئـەوەی ئـەو پرۆسـەیە بەپێـی یاسـاکانی خـوا ئەنجـام دەدرێ و، بەپێـی ویسـتی خـوا، خـوا عـزّ وجـلّ پاڵـی داوەتـە لای خـۆی، ئەگەرنـا خـوا نەهاتـوە بـە تۆبزیـی دڵیـان بگـرێ و، نەهێڵـێ ئیمانیـان بچێتـێ !

٩- ﴿ وَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡغَٰفِلُونَ ﴾ هەر ئەوانە بێئاگان، واتە: ئەوانە لە بێئاگایی دا، تەواو ڕۆچوون، بە جۆرێك کە وەك بێئاگایی (غفلة) لەوان دا کورت هەڵاتبێ.

١٠- ﴿ لَا جَرَمَ أَنَّهُمۡ فِي ٱلۡأٓخِرَةِ هُمُ ٱلۡخَٰسِرُونَ ﴾ ( لَا جَرَمَ )، بە سێ چوار مانایان لێکدراوەتەوە، کە هەموویان، واتە: بە دڵنیایی، یاخود: چەسپاوە، یاخود: بەبێ دوودڵیی،

(**لا جَرَمَ أي لا مُحَالَة**)، یان (**لا بُدَّ**)، یان (**لا حَقًّا**)، هەرسێكیان دەبنەوە بە یەك واتا، ( لَا جَرَمَ )، واتە: هیچ گومانی تێدانیە، (أَنَّهُمْ فِي ٱلْأَخِرَةِ هُمُ ٱلْخَٰسِرُونَ )، كە ئا ئەوانە لە دوارۆژدا زیانبارن، ئنجا كە بە ڕاناوی (هُمُ ) كە پێی دەگوترێ: (**ضمير الفصل**) ڕاناوی جیاكردنەوە، پاشان (**أل**)یشی خستۆتە سەر (**خاسرون**)، (ٱلْخَٰسِرُونَ )، ئەمە یانی: لە دوارۆژدا ئا ئەوانەن زیانبارانی ڕاستەقینە، كە لە زیانباریی دا نوقم بوون.

# کورتە باسێک لە بارەی

# حوکمی زۆر لێکرانەوە لەسەر کوفر و تاوان[1]

بەڕێــزان! ئەم کورتە باسە لە پازدە (١٥) بڕگەدا دەخەینەڕوو:

**بڕگـەی یەکـەم: دیـارە ئـەم ئایەتـە بەهـۆی ڕووداوێـك، یـان زیاتـرەوە هاتۆتـە خـوار، وەك لـە هـۆی هاتنـە خوارەوەکـەی دا باسـمان کـرد، کـە عەمـماری کـوڕی یـاسر خـوا لێـی ڕازی بـێ، هاوبـەش بـۆ خـوا دانـەرەکان گرتوویانـە و، ئەشـکەنجەیان داوە و، ئەویـش لـە ژێـر زەخـت و گوشـاری ئەوانـدا، هەنـدێ شـتی گوتـوە، کـە ئەوانـی پـێ لـە کـۆڵ خـۆی بکاتـەوە و، بـەڵام هەر لەوبـارەوە ئـەم بەسـەرهاتەش هاتـوە، کـە ئەگـەر ئایەتەکـە لەبـارەی ئـەو بەسەرهاتەشـەوە نەهاتبێتـە خـوار، گرنـگ ئەوەیـە، بەسـەر ئـەو بەسـەرهاتەش دا دەچەسـپێ:**

**{أَنَّ عيُونـاً لِمُسَـيْلِمَة أَخَـذُوا رَجُلَـيْنِ مِـنْ أَصْحَـابِ النَّبِـيّ ﷺ، فَذَهبُـوا بِهِـمَا إِلى مُسَـيْلِمَةَ، فَقَـالَ لأَحَدِهِـمَا: أَتَشـهدُ أَنَّ مُحَمَّـدَاً رَسُـول اللّـه؟ قَـالَ: نَعَـمْ. قَـالَ: أَتَشـهدُ أَنِّي رَسُـولُ اللّـه؟ قَـالَ: نَعَـمْ، فَخَلَّى عَنْـهُ، وَقَـالَ للآخَـرِ: أَتَشـهدُ أَنَّ مُحَمَّـدَاً رَسُـولُ اللّـه؟ قَـالَ: نَعَـمْ، قَـالَ: وَتَشـهدُ أَنِّي رَسُـول اللّـه؟ قَـالَ: أَنـا أَصَـمُّ لاَ أَسْـمَعُ، فَقَدَّمَـهُ وَضَرَبَ عُنُقَـهُ، فَجَـاءَ هَـذَا إِلى النَّبـيّ ﷺ، فَقَـالَ: هَلَكْـتُ، قَـالَ: (وَمَـا أَهْلَـكَكَ)؟ فَذَكَـر الحَدِيـثَ، قَـالَ: (أَمَّـا صَاحِبُـكَ فَأَخَـذَ بالثقـة، وَأَمَّـا أَنْـتَ فَأَخَـذْتَ بالرُّخْصَـة عَـلَى مَـا أَنْـتَ عَلَيْـهِ السـاعَة) قَـالَ: أَشـهدُ أَنَّـكَ رَسُـولُ اللّـه، قَـالَ: (أَنْـتَ عَـلَى مَـا أَنْـتَ عَلَيْـهِ)}**[2].

واتـە: دەڵـێ هەندێـك جاسووسـی موسـەیلەمەی درۆزن، دوو پیـاو لـە هاوەڵانـی پێغەمبـەر ﷺ دەگـرن، دەیانبـەن بـۆ لای موسـەیلەمە، بـە یەکێکیـان دەڵـێ: شـایەدیی دەدەی کـە موحەممـەد ﷺ، پێغەمبـەری خوایـە؟ دەڵـێ: بەڵـێ، دەڵـێ: شـایەدیی دەدەی کـە منیـش

---

(١) ئـەم باسـەمان زۆربـەی هـەرە زۆری لـە تەفسـیری (الجامـع لأحـكام القـرآن)ی (القرطبـي) بەرگـی (١٠)، لاپـەڕە: (١٤٨- ١٥٨)، وەرگرتـوە، بـەڵام بێگومـان جگـە لـەوەی دەقەکـەی خـۆی دێنـم، ئـەوی دیکـە هەندێکـی بـە داڕشـتنی خـۆم دادەڕێژمـەوە، بـەڵام دەسـتکاریی نێوەڕۆکـی قسـەکانی ئـەو ناکـەم، مەگـەر قسـەیەکم بـە دڵ نەبـێ، قسـەکەی دێنـم، دوایـی قسـەی خۆمـی لەسـەر دەکـەم.

(٢) (الجامـع لأحـكام القـرآن)، ج ١٠، ص ١٤٨، لێکۆڵـەرەوە و، (مخـرِّج)ی دەقـەکان گوتوویەتـی: (مَرْسَـل)ە یـانی: یەکسـەر لـە تابیعییـەوە دراوەتـە پـاڵ پێغەمبـەر ﷺ، بـێ ئـەوەی بـاسی هـاوەڵ (صحـابي) بکـرێ.

